وتاری بیست و پێنج

زنجیرە وتاری (شیرک و شیرکی گوێڕایەڵیکردن)

# الشِّرْكُ وَشِرْكُ الطَّاعَةِ

## يوســـف -عليه السـلام- المـــفتري عليه

## بوهتانی هەڵبەستراو بۆ پێغەمبەر یوسف (علیه السلام)


شێخی موجاهید

أبو علي الأنباري
تقبله الله



وەرگێڕان و ئامادەکردنی

پێگەی ڕاستەڕێ





پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری
شێخ ئەبی عەلی ئەنباری -تقبه الله-

وتاری (بیست و پێنج)

بەناونیشانی
بوهتانی هەڵبەستراو بۆ پێغەمبەر یوسف(عليه السلام)
یوسف (عليه السلام) المفتري عليه

وەرگێڕانی
پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودمەندمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە بەڵگە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ وکۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت

لە فەزڵ و بەخششی الله تعالى تەواو بووین لە باسی حاڵ و حوکمی ئەوانەی دەچنە نێو پەرلەمانەکان لە پەڕتوکی الله عز وجل، وە ئایەتی کۆتایی کە لە لای وەستاین ﴿إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى ۙ الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴾[1]، وتەیەکی ئیمامی (الشنقيطي -رحمه الله-) هەیە لە قسەکردنی دەربارەی ئەم ئایەتە پیرۆزانە، دەیخوێنمەوە بە دەقەکەی هەروەك وتویەتی چونکە وتەیەکە و ناتوانین هیچ شتێکی بۆ زیاد بکەین، شێخ -رحمه الله- لە (أضواء البيان) دەڵێت: "بزانە کە هەموو مسوڵمانێك پێویستە لەسەری لەم سەردەمەدا سەرنج بدات و ورد ببێتەوە لەم ئایەتانە (مەبەستی ئایەتەکانی سوڕەتی محمد ـە (ﷺ)) لە سوڕەتی محمد و ڕابمێنێت لێیان، وە وریابوونی تەواو لەوەی لەخۆی گرتووە لە بەڵێنە سەختەکان لەبەرئەوەی زۆرێك لەوانەی خۆیان دەدەنە پاڵ مسوڵمانان بەبێ گومان دەچنە نێو ئەوەی لەخۆی گرتووە لە بەڵێنە سەختەکان، چونکە کافران بە گشتی لە ڕۆژهەڵاتییەکان و ڕۆژئاواییەکان ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی محمد (ﷺ) کە ئەویش ئەم قورئانەیە و هەروەها ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بەهۆیەوە ڕوونی کردۆتەوە لە سونەنەکان، جا هەر کەسێك بەو کافرانە کە ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە بڵێت: (سنطيعكم في بعض الأمر) ئەوە دەچێتە نێو چوارچێوەی هەڕەشەی ئایەتەکە، وە لەو کەسەش شایستەتر ئەو کەسەیە پێیان دەڵێت (واتە شایستەترە بۆ ئەوەی حوکمی ئایەتەکە بیگرێتەوە) ئەو کەسەیە پێیان دەڵێت "سنطيعكم في الأمر" وەك ئەوانەی شوێنی قانونە دەستکردەکان دەکەون کە بەهۆی ئەمەوە گوێڕایەڵی ئەوانە دەکەن کە ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە، جا ئەوانە گومانی تێدا نیە لەو کەسانەن کە فریشتەکان لە کاتی گیانکێشانیان لە ڕووخساریان و پشتیان دەدەن و هەروەها ئەوان شوێنی شتانێك کەوتن کە الله

(١) محمد: ٢٥.

تورە دەکات و بێزاریش بوون لە ڕەزامەندی الله و حەزیان نەدەکرد بەو شتانەی دەبووە هۆی ڕەزامەندی الله بۆیە ئەویش کردەوەکانیانی پوچەڵ کردەوە، بۆیە هۆشیاربە بە هۆشیاربوونێکی تەواو لەوەی بچیتە ڕیزی ئەوانەی دەڵێن (سنطيعكم في بعض الأمر)" وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله-.

ئەمڕۆ بە ویستی الله تعالی بابەتێکی تر تاوتوێ دەکەین لە بابەتەکانی پەرلەمان، وە دەوەستین لە لای بابەتی؛ ئەو کەسانەی چوونە پەرلەمان بۆ خۆیان جائیز دەکەن چی دەکەنە بەڵگە؟ هەندێك دەق دەکەنە بەڵگە، کۆمەڵێك بەڵگەیان هەیە کە خۆیان پێی دەڵێن بەڵگە، وە لە پێشەکییەکانی ئەو بەڵگانە کە پشتی پێدەبەستن؛ قەزیەی یوسف ـە (عليه السلام)لەگەڵ فیرعەونی میسر، جا ئایا ڕاستییەکە چییە و چۆن ئەوانە بەڵگە دەهێننەوە بە چیرۆکی پێغەمبەر یوسف -درودی الله لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت- ؟ سەرەتا پێویستە بزانی کە پێغەمبەر یوسف بوهتانی بۆ کراوە لە لایەن دوو لایەنەوە، لایەنی یەکەم؛ ژنی عەزیزی میسر کاتێك ئەوی (عليه السلام)تۆمەتبار کرد ئەمە چینێکیان، لایەنی دووەم؛ ئیخوانی میسر -پەنا بە الله لێیان- تۆمەتباریان کرد لە پێغەمبەرایەتییەکەی کاتێك دەربارەی ئەو وتیان: بەشداری کردووە لەگەڵ فیرعەونی میسر لە حوکمدا، وە ئێمەش بەگوێرەی ئەم قسەیە بەهەمان شێوە ئێمەش بەشداری دەکەین لەو حکومەتە تاغوتییانە، سەبارەت بە قەزیەی ژنەکە کە پێغەمبەر یوسف ـی تۆمەتبار کرد -درودی الله لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت- ئەوا الله تعالی هەواڵ و بەسەرهاتی ئەمەی پێڕاگەیاندووین بەجۆرێك کە بەسانە، بەڵام ئەوانە کاتێك تۆمەتباریان کرد لە پێغەمبەرێتیەکەی ئەوا لێرەدا پێویستە هەڵوەستە بکەین بۆ ئەوەی ورد ببینەوە لە قسەی ئەو جۆرە کەسانە، وە چۆن شەیتان بۆی ڕازاندوونەتەوە و قسەی بۆ کردوون، وە چۆن خەڵکیان هاندا لەسەر ئەم فڕوفێڵە و قایلیان کردن کە لەگەڵ تاغوتبوون لە کاری پێغەمبەر یوسف ـە! –پەرژین بێت لەو-، بابەتی یەکەم کە لە لای دەوەستین؛ ئەو پاشایەی لە سەردەمی پێغەمبەر یوسف بوو -فیرعەونی میسر-، ئایا مسوڵمان ببوو یان مایەوە لەسەر ئەو کوفرەی کە لەسەری بوو؟ لە زانایانی مسوڵمانان هەیە کە وتویانە مسوڵمان بووە هەروەك ئیمامی تەبەڕی -رحمه الله- لە موجاهید ـەوە دەگوازێتەوە و دەڵێت: ئەو پاشایەی یوسف لەگەڵیدا بوو مسوڵمان ببوو، کە ئەمەش وتەی ابن كثير ـە -رحمه الله- لە تەفسیرەکەیدا، سەبارەت بە قورتوبی -رحمه الله- لەبارەی ئەم پاشایە دەڵێت: "وە فیرعەونی یوسف کەسێکی باش و چاك بوو"، ئەمە وتەی ئیمامی قورتوبی، بەڵام زاناکانی تر و تەفسیرەکانی تر ڕێککەوتوون لەسەر دەستەواژەیەك، ئەم دەستەواژەیە بریتییە لەوەی کە پاشاکە ئەو کاتە (ريان بن الوليد) بووە، واتە لە سەردەمی هەبوونی پێغەمبەر یوسف پاشاکە (ريان بن الوليد) بوو کە پیاوێکە لە (العماليق) و باوەڕی هێنابوو بە پێغەمبەر یوسف، ئەم وتەیە بەم شێوەیە ئیمامی (أبو حفص الحنبلي دمشقي) وتویەتی لە تەفسیرەکەی (اللباب في علوم الكتاب)،

هەروەها نەیسابوری وتویەتی لە تەفسیرەکەی، هەروەها ماوەردی وتویەتی لە (النكت والعيون) -ڕەحمەتی الله ـیان لێبێت-، هەروەها ئالوسی وتویەتی لە تەفسیرەکەی، کەوابوو ئەو زانایانە بە جیاوازی ناوچەکانیان و سەردەمەکانیان وتویانە کە ئەم پاشایە مسوڵمان ببوو و باوەڕی هێنا بە پێغەمبەر یوسف، جا ئەگەر قسەمان کرد بەگوێرەی وتەی ئەو بەڕێزانە لە موفەسیرەکان و زانایان ئەوا هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر دروستبوونی چوونە نێو حوکمی تاغوتان و لەگەڵ پەرلەمانییەکان و هاوشێوەی ئەمانە، بۆچی؟ چونکە یوسف -عليه السلام- پێغەمبەرێك بوو و کاری دەکرد لەگەڵ پاشایەك کە باوەڕی پێهێنابوو کەوایە بەڵگە هێنانەوەکە بەمە کۆتایی پێهات ئەگەر بۆچوونی ئەو زانایانەمان وەرگرت کە وتویانە ئەو پاشایە مسوڵمان ببوو.

بەڵام ئەوانەی لە زانایان وتویانە مسوڵمان نەببوو و نەهاتە نێو ئیسلام و شوێنی پێغەمبەر یوسف نەکەوت، بەگوێرەی ئەم وتەیە و وەك خۆگونجاندێکیش لەگەڵ ئەوانە -پەنا بە الله- دەڵێین ئەگەر بچەسپێت یاخود ئەگەر گریمان بڵێین کە ئەم پاشایە مسوڵمان نەببوو و شوێنی پێغەمبەر یوسف نەکەوت، ئینجا ئایا پێغەمبەر یوسف بەشداری لەگەڵ کرد، وە بەشداریکردنەکەی چۆن بوو، وە ئەوانە چۆن بەڵگە دەهێننەوە لەسەر ئەم بەشداریکردنە؟ بەڵام بەر لە چوونە نێو بابەتەکە پێویستە ڕوو بکەینە الله عز وجل بە پاڕانەوە بەهۆی ئەوەی قسە دەکەین دەربارەی پیاوێك کە الله تعالى زاناترە بە حاڵی ئەو، جا ئەگەر مسوڵمان بووبێت ئەوە پەنا بە الله دەگرم لەوەی وشەی کوفر بدەمە پاڵ ئەم پیاوە لە کاتێکدا هاتووەتە نێو ئیسلام، بەڵام ئەگەر جگە لەمە بێت ئەوا کوفر دەدەینە پاڵی هاوشێوەی ئەو زانایانەی وتویانە ئەو نەهاتۆتە نێو ئیسلام ئەمە هۆکاری یەکەم، وە هۆکاری دووەمیش بۆ ئەوەی ئەم بوهتان و تۆمەتە دووربخەینەوە لە پێغەمبەر یوسف -درودی الله تعالى لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت- وە پەنا بە الله دەگرم لەوەی کە ئەم پیاوە ئەگەر مسوڵمان بووبێت ببێتە نەیارم لە ڕۆژی قیامەت، شێوازی بەڵگە هێنانەوەی ئیخوانی میسر بە چیرۆکی پێغەمبەر یوسف، دەڵێن یوسف (عليه السلام)بەشداری و هاوبەشی کردووە لە حوکم لەگەڵ پاشای میسر -لەگەڵ فیرعەونی میسر- هاوکات ئەوان بڕوایان وایە کە فیرعەونی میسر مسوڵمان نەبووە و نەهاتووەتە نێو ئیسلام و شوێنی پێغەمبەر یوسف نەکەوتووە، بەپێی ئەم وتەیە ئەوان کافربوونی پاشاکە جێگیر دەکەن پاشان دوای ئەمە ئەوە جێگیر دەکەن کە پێغەمبەر یوسف بەشداری کردووە لەگەڵ ئەم پاشایە لە حوکمدا، جا بەگوێرەی ئەم وتەیەیان کاتێك پێغەمبەرێك بەشداری کردبێت لەگەڵ تاغوتێك لە حوکمدا کەوایە زیانەکە لە کوێیە ئەگەر بەشداریمان کرد لەگەڵ ئەو تاغوتانە لە حوکمدا؛ ئەگەر چووینە پەرلەمان، ئەگەر وەزارەتەکانمان وەرگرت، ئەگەر لێپرسراویەتی گەنجینەکان و سامانی وڵاتمان وەرگرت، زیانەکە لە کوێیە مادام پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی الله عز

وجل چوو بێتە نێو و بەشداری کردبێت لەگەڵ تاغوتێك لە تاغوتەکان لە حوکمدا ؟! وەڵامدانەوە لەسەر ئەم بەڵگە هێنانەوەیە بەم شێوازە؛ یەکەم: شێوازی بەڵگە هێنانەوەی ئیخوانی میسر -پەنا بە الله لێیان- ئەم شێوازە لە بەڵگە هێنانەوە پێی دەوترێت "قیاس"، واتە ئەوان ئەسڵێکیان هێناوە و پاشانیش فەرعێکیان هێناوە و ئینجا حوکمێکیان هێناوە و پاشانیش عیللەت و هۆکارەکەیان بینیوەتەوە، چونکە کۆڵەکەکانی قیاس هەروەك دەزانیت ئەسڵ و بنچینەیەك هەیە کە ئەوەیانە قیاسەکەی لەسەر کراوە، وە فەرع و لقیش هەیە ئەویش قیاس کراوەکەیە، وە حوکمی ئەسڵی هەیە و هۆکاریش لە ئەسڵەکەدا هەیە، جا ئەگەر قیاس کراو و قیاس لەسەر کراوەکە هەبوون و حوکمەکەش هەبوو، وە هۆکارەکەش بوونی هەبوو لە ئەسڵەوە تا فەرع ئەو کاتە دەکرێت حوکمی ئەسڵەکە بەکاربێنین لەسەر فەرعەکە، ئەمەیە قیاس و ئەمەش بریتی بوون لە کۆڵەکەکانی قیاس لە لای زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە، جا یوسف (عليه السلام)ئەسڵەکەیە و ئەوانیش فەرعن، حوکمەکە؛ دروستیێتی چوونە ناوەوەی یوسف (عليه السلام)مۆڵەتیان دەدات بە چوونە نێو ئەو جێگەیەی پێغەمبەر یوسف چووەتە ناویەوە، عیللەت و هۆکاری هاوبەش؛ ویستی هەندێك بەرژەوەندی بهێنێتە دی ئێمەش دەمانەوێت هەندێك بەرژەوەندی بهێنینە دی، کەوایە بە گومانی خۆیان، وا گومانیان بردووە کە قیاسیان چەسپاندووە، ئێستا لێکۆڵینەوە دەکەین لەوەی ئایا ئەم قیاسە قیاسێکی دروستە یان قیاسێکی پوچەڵە، چونکە زانایان -رحمهم الله- زیندوو و مردووەکانیان کاتێك باسی قیاس دەکەن دابەشی دەکەن بۆ دوو بەش؛ قیاسی ڕاست و دروست هەیە و قیاسی پوچەڵیش هەیە، جا ئایا ئەم قیاسە کە دەیکەنە بەڵگە لە قیاسی دروستە یان لە قیاسی پوچەڵە؟ بەراوردێك دەکەین لە نێوان پێغەمبەر یوسف -درودی الله لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت- و ئەوانە، سەیری جیاوازییەکان بکە لە نێوان یوسف (عليه السلام)و ئەوانەدا، جیاوازی یەکەم: ئەوەیە کە پاشای میسر خۆی ناردی بەدوای پێغەمبەر یوسف و بانگهێشتی کرد ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ۚ إِنَّ رَبِّى بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ ۝٥٠﴾[(١)] ، واتە: پاشاش وتی ئادەی بچن بۆم بهێنن، جا کاتێك کە ڕەوانەکراوەکەی پاشا گەیشتە لای یوسف و (وتی: پاشا داوات دەکات، یوسف) وتی: بگەڕێرەوە بۆ لای پاشا و جا پێی بڵێ: هۆی چی بوو ئەو ئافرەتانە کاتی خۆی دەستی خۆیان بڕی و برینداریان کرد (ئایا من هیچ تاوانێکم لەوەدا هەیە؟!) بەڕاستی هەر پەروەردگارم بە ئاگایە لە فێڵ و تەڵەکە و پیلانیان. کەوایە بابەتەکە ئێستا ئەوەی چەسپاوە ئەوەیە کە پاشا بەدوای پێغەمبەر یوسفی نارد؛ ئەم پیاوەم بۆ بهێنن، بەڵام پێغەمبەر یوسف بە خێرایی دەرنەچوو وەك بەدەمەوە هاتنێك بۆ حەزی پاشا و بۆ فەرمانی و بۆ ویستی ئەو، بەڵکو سوور بوو لەسەر مانەوە لە زیندان و بە

(١) یوسف: ٥٠.

نێردراوەکەی پاشای وت: بگەڕێرەوە بۆ لای ئەم پاشایە، وە لێی بپرسە دەربارەی ئەوەی هۆی چی بوو کاتی خۆی ئەو ئافرەتانە دەستی خۆیان بڕی و برینداریان کرد، بەڕاستی هەر پەروەردگارم بە ئاگایە لە فێڵ و پیلانیان، ئەمەیە حەقیقەتی پێغەمبەر یوسف، ئەوە پاشا بوو کە بەدوای نارد، بەڵام ئەوانە سەرەتا دەبێت ئەندام بن لە حیزبێك دوای ئەوەش ئەم حیزبە کاندیدەکانی پێشکەش دەکات بۆ چوونە نێو حوکمی تاغوتان و لەگەڵ ئەم حکومەتەدا، وە دوای قبوڵکردنی ناوەکان قۆناغی ڕێکلام و ڕاگەیاندنەکان و دانانی وێنەکان و بەڵێندانەکان دەست پێدەکات، دوای ئەوە چاوپێکەوتنەکان و کاریگەری دروستکردن لە ڕێگەی بەڵێنە ساختە و درۆکان دەبێت، وە لە ڕێگەی ئەوەی کە ئەوان هەندێك چارەسەر دەخەنە ڕوو بۆ هەندێك کێشە، پاشان دوای ئەمە کاریگەری دروستکردن لە ڕێگەی پتەوکردنی پەیوەندییەکان و پاشان قۆناغی بەرتیلدان دێت، دوای هەموو ئەمانە هەڵبژاردنەکان بەڕێوە دەچن جا بەشێك لێیان دەپاڵێورێن بۆ چوونە نێو پەرلەمان، ئەمە حاڵی پەرلەمانە و ئەوەی تریش حاڵی پێغەمبەر یوسف جا چ لێکچوونێك هەیە لە نێوان پێغەمبەر یوسف و ئەوانەدا لە جیاوازی یەکەم؟ وە ئەمەی وتم قبوڵکراوە لە قیاسدا بەوەی جیاوازییەکە لە نێوان پێغەمبەر یوسف و ئەو چەپەڵانە -پەرژین بێت لە ڕووتان-، کەوابوو جیاوازی یەکەم ئەوە بوو پاشاکە بانگهێشتی ئەوی کرد بەڵام ئێوە؛ ئێوە خۆتان هەوڵدەدەن بە قاچەکانی خۆتان بەو ڕێگەیەی باسم کرد بۆ چوونە گەر تاغوتان لە حوکمدا ئەمەش لە قیاسدا جیاوازییە

شتێکی تر ئەوەیە کە پاشاکە کاتێك بانگهێشتی پێغەمبەر یوسفی کرد، بانگهێشتی نەکرد تەنها دوای ئەوە نەبێت کە بۆی ڕوون بووەوە ئەو خاوەن زانستە و هەروەها پاکە، وە ئەوەی کە زیندانی کراوە بە ستەم، چونکە نێردراوەکە دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ لای پاشا، پاشا بانگی ئافرەتەکانی کرد و وتی﴿قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَاوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ قُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ ۚ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْـَٰٔنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾﴾[1] ، واتە: (پاشا) پێی وتن: ئەو کارە گرنگەتان چی بوو کاتێك ئێوە ویستتان یوسف لە خشتە بەرن (ئایا ئەو هیچ تاوانێکی هەبووە؟) هەموو وتیان: پەنا بە الله (ئێمە بوهتانی بۆ بکەین) ئێمە هیچ جۆرە هەڵە و ناشرینیەکمان لێ نەدیوە و نەزانیوە، (ژنەکەی عەزیزی میسڕ) وتی: ئا ئێستا ئیتر ڕاستی ڕوون و ئاشکرابوو، خەتای من بوو و دەمویست لە خشتەی بەرم و بەڕاستی یوسف لە ڕاستگۆیانە. کەوایە ئێستا پاشا دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لە حاڵی یوسف ئینجا بۆی دەرکەوت کە لە پێغەمبەر یوسف دوو سیفەت هەیە؛ سیفەتی یەکەم ئەوە بوو کە ئەو خاوەن زانستە چونکە خەونەکەی ئەوی لێکدایەوە کە ئەمەش هیچ یەکێك لە پیاوماقوڵانی لەدەوری فیرعەونی میسڕ بوون

(١) یوسف: ٥١.

نەیانتوانی لێکی بدەنەوە؛ ئەی پیاوماقوڵان و شارەزایان ئەم خەوەم بۆ لێك بدەنەوە، وتیان ناتوانین ئەم خەونەت لێك بدەینەوە، جا پێغەمبەر یوسف خاوەن زانست بوو کە هەر ئەمەش چەسپا بۆ پاشاکە لەو کاتەدا، شتێکی تر کە چەسپا لە لای پاشا بریتی بوو لەوەی ئەو پاك و دەستپاکە و ئافرەتەکان دەورەیان لێدابوو، وە تۆ دەزانیت کە لە نموونەی ئەم جێگەیانەدا پێیەکان هەڵدەخلیسکێن -پەنا بە الله- گەنجان خۆیان بەدوای ئەم کارەوەن جا چی بگات بەوەی ئافرەتان داوا بکەن و گەنجیش ئارەزوویان لێدەکات بۆیە هیچ پاکییێك نیە لەسەرووی ئەم پاکیەوە، وە تۆ فەرموودەی رسول الله (ﷺ) دەزانی کە حەوت چین هەن الله تعالی دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆی لە ڕۆژێکدا هیچ سێبەرێك نیە تەنها سێبەری ئەو نەبێت؛ لەنێو ئەوانەشدا پیاوێکە ئافرەتێکی جوان بانگی دەکات بۆ کاری خراپە ئەویش دەڵێت: من لە الله پەروەردگاری جیهانیان دەترسم، یوسف لەم جۆرەیانە، زانست و پاکی، هەر بۆیە پاشا بانگهێشتی کرد و وتی: ﴿ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ﴾[1] واتە: ئادەی بچن بۆم بهێنن و تایبەتی دەکەم بۆ خۆم و لە نزیکانی من بێت. واتە دەیکەم لە کەسە تایبەتەکانی خۆم، هەرچەندە پێش دەرکەوتنی ئەم تایبەتمەندییانە و ئەم سیفەتانە لە لای پێغەمبەر یوسف، دوورخرابووەوە لە زیندانی ئەم پاشایە، بەڵام بەهۆی دەرکەوتنی زانست و بەهۆی دەرکەوتنی پاکی پاشاکە وتی: بۆمی بهێنن و تایبەتی دەکەم بۆ خۆم؛ واتە دەیکەمە یەکێك لە کەسە تایبەتەکانی خۆم و لەوانەی نزیکن لێم، ئەمە لە لای پێغەمبەر یوسف، بەڵام لە لای ئەفلاتونییەکان ئەو دیموکراسیخوازانە، ماددەی ٤٧ لە دەستوری عێراقی دەڵێت: "مەرجە بۆ پاڵێوراو بۆ چوونە پەرلەمان کە عێراقی بێت و لێهاتوویی تەواوی هەبێت" بۆ چوونە پەرلەمان تەنها ئەم دوو مەرجەیان داناوە مەرجی یەکەم: دەبێت خاوەنی ڕەگەزنامەی عێراقی بێت؛ واتە مسوڵمانێك لە شوێنێکی تر قبوڵ نەکراوە، کافرێك لە شوێنێکی تر قبوڵ نەکراوە، پێویستە ڕەگەزنامەی عێراقی هەڵگرتبێت کە لەمەشدا درۆ دەکەن چونکە زۆربەی ڕافیضە ئەوانەی ئێستا حوکمی باشووری عێراق دەکەن ڕەگەزنامەی دەوڵەتانی تریان هەیە، وە مەرجی دووەم ئەوەیە لێهاتوو و پێگەیشتوو بێت، وە ئەمەش وا گومان مەبە کە دەبێت: ئازاد، عاقڵ، بالغ، مسوڵمان بێت، نەخێر بەڵکو بەسە کە بالغ و عاقڵ بێت جا ئەگەر تەنها ئەم مەرجانە هاتنە دی ئەو کاتە دروستە بۆ ئەم پاڵێوراوە ڕێگای هەڵگەڕانەوە و کوفر بگرێتە بەر بۆ گەیشتنە پەرلەمان؛ ئەمانە لە مەرجەکانی پەرلەمانییەکان و ئەوەی تریش ئەوە بوو کە دەرکەوت لە پێغەمبەر یوسف -درودی الله لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت-، دێینە سەر زانست و پاکی لە لای ئەوانە، سەبارەت بە زانست ئەوا زۆربەی ئەوانەی ئێستا حوکم دەکەن خاوەنی بڕوانامەی ساختەن، سەبارەت بە دەستپاکیش ئەوا حکومەتی ڕافیضی بەهۆی دزی و بردنی پارە و

---

(١) یوسف: ٥٤.

سامان ناچار بوون لیژنەیەك پێكبهێنن ناویاننا لیژنەی دەستپاكی، پاشان دەركەوت كە لیژنەی دەستپاكیەكە پێویستی بە لیژنەیەكی دەستپاكیە! كەوایە پاكی لە كوێیە؟! وە زانست لە كوێیە؟! یەكێك لە ئەندامانی پەرلەمان كە كەسێكی زمان پاراو و قسەزانە -پەنا بە الله- لە هەموو كەناڵێك دەردەكەوێت، جارێكیان وەستا لە پەرلەمان و ئایەتێكی هێنایەوە؛ "الله تعالى دەفەرمويت: بسم الله الرحمن الرحيم، إن العدل أساس الملك، صدق الله العليّ العظيم" الله تعالى خراپى و عەيبى دەرخست، بە پەتى قسە دەكات، ئەندامێكی پەرلەمانە "إن العدل أساس الملك، صدق الله العليّ العظيم" چونكە ئەو ڕافیضییە، كوانێ زانست؟! كوانێ پاكی؟! پاشانیش دەڵێی حاڵی ئەو وەك حاڵی پێغەمبەر یوسف ـە ؟! دەڵێت ئێمە خاوەنی زانست و بڕوانامەین؛ ئەمە ماجستێر و ئەمە دكتۆرا و ئەمە زانستی فەرمووده و ئەمە تەفسیر جا ئێمە زانستمان هەیە! وە ئێمە پاكین هیچ شتێك لە سامانی دەوڵەت نابەین! دەوترێت تەنانەت ئەگەر ئەم مەرجانەشت لێبێتەدی ئەوا لە ڕاستیدا بە مەرج دانەنراون بۆ چوونە نێو ئەو شوێنە، ئەم مەرجانە نین هەرچەندە ئەگەر لێت هاتبێتە دی، ئەوان ئەم مەرجانەیان ناوێت، كەوایە تۆ دەچیتە جێگەیەك كە نە زانست تیایدا مەرجە و نە پاكی، سەبارەت بەوەی بانگەشەی بۆ دەكەی ئەوا هیچ خێر و چاكەیەكی تیادا نیە لەبەرئەوەی ئەگەر خێرێكی تیادا بوایە ئەوا نەیدەبردی بۆ ئەم جێگەیەی هەڵگەڕانەوە، وە نەیدەبردی بۆ جێگەیەك كە دژایەتی الله و پێغەمبەرەكەی بكەی و دژایەتی موجاهیدانی ڕێگای الله بكەی، وە هەوڵ بدەی دەوڵەتێكی ئیسلامی نەهێڵی كە ڕاگەیەنراوە و حوكم دەكات بەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە پاشان دەوترێت بەو خاوەن زانستە؛ چ سوودێك هەیە لەو زانستەی وات لێدەكات بوەستی لە پاڵ تاغوتان پاشان دژایەتی مسوڵمانان بكەی بۆ ئەوەی دەوڵەتێكی تاغوتی دابمەزرێت و دەوڵەتێكی ئیسلامی لاببەی و نەهێڵی؟! ئەمە چ زانستێكە كە تۆ بانگەشەی دەكەیت؟ جا ئەمە لە قیاسدا جیاوازییە، ئەمە حاڵی پێغەمبەر یوسف بوو و ئەمەش حاڵی ئەوانە، جیاوازی سێیەم: پێغەمبەر یوسف هیچ ڕێچكەیەكی كوفریی نەگرتەبەر -پەرژین بێت لەو- بۆ گەیشتن بە پاشا بەڵكو ڕاستەوخۆ لە زیندانەوە بۆ كۆشكی پاشا، هیچ هۆكارێكی ناشەرعی نەگرتەبەر بۆ گەیشتنە كۆشكی پاشا و ئەم فیرعەونە، ئەمە حاڵی پێغەمبەر یوسف، بەڵام حاڵی ئەوانە؛ بیرتانە باسی ئەو جێگایانەی هەڵگەڕانەوەمان كرد، دەچێتە نێو چوار جێگەوە بەر لەوەی بگاتە پەرلەمان، چوار جێگەی هەڵگەڕانەوە پێویستە بچێتە ناویەوە پێش ئەوەی بگاتە پەرلەمان و كورسیێك بگرێت بۆ خۆی لەژێر گومەزی پەرلەمان، جێگەی كوفریی یەكەم ئەوەیە پێویستە دان بنێت بە دەستوری نووسراو و كارپێكراو لە وڵاتدا، پێغەمبەر یوسف ئەم كارەی لێ داوا نەكرا، دووەم شت: دەبێت باوەڕی بە فرە حیزبی هەبێت، هیچ شتێكی لەم شێوەیە بوونی نیە لە لای پێغەمبەر یوسف، سێیەم شت: پێویستە باوەڕی هەبێت بە

بنەمای دەستاودەستکردنی دەسەڵات، پێغەمبەر یوسف ئەمەشی لێ داوا نەکرا، چوارەم شت: پێویستە سوێند بخوات لە لای دەرگای پەرلەمان بەر لەوەی بچێتە ژوورەوە بۆ ئەوەی دەربچێت لە دین ئەگەر شتێکی تیادا مابێت لە ئیسلام، پێغەمبەر یوسف هیچ یەکێك لەم شتانەی لێ داوا نەکرا، ئەمەش لە قیاسدا جیاوازییە، کۆتا شت یاخود پێش کۆتا -جیاوازی چوارەم- ئەوەیە پاشا دوای ئەوەی پێغەمبەر یوسف گەیشتە لای -درودی الله لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت-، وە گوێی لێگرت و بارودۆخی ئەوی زانی پاشا پێی وت: ﴿إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ﴾[1]، واتە: ئەمڕۆ ئیتر بەڕاستی تۆ لای ئێمە خاوەنی پلە و جێگەی متمانە و باوەڕی. سەرنج بدە زانایان چییان وتوە لەبارەی وشەی (مَكِينٌ)، هەموو ئەو وتانەی وتویانە لە ئیمامی تەبەڕی و قوڕتوبی و شەوکانی -رحمهم الله- لە دەوری یەك شت دەخولێتەوە: بەوەی تۆ خاوەن قسەی و بەگوێت دەکرێت، -سەرنج بدە- ئیمامی تەبەڕی -رحمه الله- لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت، ﴿إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ﴾ مانای (مَكِينٌ) چییە؟ دەڵێت: "تواناداری لەوەی دەتەوێت"، ئەمە وتەی ئیمامی تەبەڕی، سەبارەت بە وتەی ئیمامی قوڕتوبی ئەوا دەڵێت: نافذ القول، سەبارەت بە جگە لەوان لە زانایان وەك ئیمامی (الرازي -رحمه الله-) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: "فلان مكين عند فلان بمعنى بيّن المكانة (أي المنزلة، بيّن بمعنى واضح المكانة والمنزلة) وهي حالة يتمكن بها صاحبها مما يريد" ئەمە وتەی (الرازی)، سەبارەت بە وتەی شەوکانی -رحمه الله- دەڵێت: "مانای (مَكِينٌ) ؛ خاوەن پلە وپایە و دەستپاکی، بەجۆرێك توانای هەیە لەوەی دەیەوێت لە پاشا"، کەوایە دەتوانین تێگەیشتنی زانایانمان پوخت بکەینەوە بۆ وشەی (تمكين) لەم ئایەتەدا کە پێغەمبەر یوسف ئازاد بوو لە هەڵسوکەوتکردنی لە کارەکانیدا، قسەی وەرگیراو و جێبەجێکراوە، تواناداره لەوەی دەیەوێت، دەتوانێت لە پاشا داوا بکات و پاشاش داواکارییەکەی ڕەت نەکاتەوە بۆیە قسە وەرگیراو بووە، پێغەمبەر یوسف قسە وەرگیراو بووە لە لای پاشا، ئەوەی وتویەتی ڕەت نەکراوەتەوە، ئەمەش وتەی پاشا و بەڵێنەکەی بوو بۆ پێغەمبەر یوسف، باشە، کامە لە ئەندامانی پەرلەمان دەتوانێت بە خۆی یان جگە لە خۆی بڵێت تۆ قسەت وەرگیراوە و جێبەجێکراوە؟ واتە ئەی فڵان بۆت هەیە ڕەفتار بکەی لەو وەزارەتەی تۆ تیایدایت هەر چۆنێکت بوێت، جا هەموو ئەوەی دەیکەیت دەستورە و هەموو ئەوەی دەیڵێیت قانونە، پێداچوونەوە ناکەین لەوەی دەیڵێیت و پێداچوونەوە ناکەین لەوەی دەیکەیت بەڵکو قسەی بڕاوە و وەرگیراوت بۆ هەیە لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئەم وەزارەتە، ئایا کەسێك هەیە بتوانێت نموونەی ئەم قسەیە بڵێت بە هیچ یەکێك؟ ناکرێت، بەڵکو ئەو زەلیلانە ئەگەر یەکێکیان سەرپێچی شتێك

(١) یوسف: ٥٤.

بکات لە ڕێکخەرەکانی قانون یان ڕێکخەرەکانی دەستور ئەوا کاربەدەستەکەی بەندی دەکات، وە بیرت نەچێت پەرلەمان لە ئەرکەکەیان ئەو ماددەیەی باسمان کرد "وە ئەنجومەنی نوێنەران تایبەتە بەم کارانە؛ یەکەم: دانانی قانونەکان، دووەم: چاودێریکردنی کارەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکاری"، بۆیە تۆ ناتوانی سەرپێچی هیچ شتێك بکەی لە قانون و ناتوانیت سەرپێچی هیچ شتێك بکەی لە دەستور چونکە ئەندامانی پەرلەمان بە لایەنێکی چاودێریکردن دادەنرێن بۆ هەڵسوکەوتەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکاری، جا ئەگەر سەرپێچیت کرد ئەوا دەتهێننە دانیشتنێك و داوای وەڵامت لێدەکەن، بۆیە لەم حکومەتە تاغوتییانە هیچ کەسێك نیە بتوانێت بە کەسێکی تر بڵێت کە ئەوەی تۆ دەیڵێیت هەر ئەوە دەبێت و چون یەکە پێچەوانەی قانون بێت یان پێچەوانەی دەستور، شتی وا بوونی نیە لە کاتێکدا ئەمە ڕوویدا بۆ پێغەمبەر یوسف -درودی الله لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت- لەگەڵ ئەم پاشایە، ئەمەش هەروەك دەزانیت لە قیاسدا جیاوازییە، سەبارەت بە جیاوازی کۆتایی: پێغەمبەر یوسف کاتێك گەنجینە و سامانی وڵاتی وەرگرت ئەوا گەنجینە و سامانەکەی بەڕێوە برد بەو شێوەیەی خۆی پێی باش بوو، وە بەو شێوەیەی خۆی دەیەویست، بەڵگە چییە لەسەر ئەم وتەیە؟ چونکە پاشا وتی: " **إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٌ** " واتە ئەوەی دەیڵێیت و ئەوەی دەیکەیت لە بەڕێوەبردنی ئەم گەنجینانە هەر ئەوە دەبێت و جێبەجێ دەکرێت جا چون یەکە یەکبگرێتەوە لەگەڵ قانونی پاشا یان پێچەوانەی قانونی پاشا بێت ئیتر ئەمە گرنگ نیە بۆی، کەوایە بەڕێوەبردنی گەنجینەکانی دەکرد بەگوێرەی ئەوەی خۆی بە باشی دەزانی نەك بەگوێرەی قانونی پاشا؛ ئەمە لە لای پێغەمبەر یوسف، بەڵام ئەم چەپەڵانە کاتێك وەزارەتێك لە وەزارەتەکان وەردەگرن ئەم شتەیان بۆ نیە بەڵکو وەزارەتەکە وەردەگرن بەگوێرەی ڕێکخەرەکانی دەستور و بەگوێرەی ڕێکخەرەکانی قانون ، وە هەروەك دەزانیت ئەمە لە قیاسدا جیاوازییە، ئینجا کە ئەم جیاوازییانە چەسپا لە نێوان پێغەمبەر یوسف -درودی الله لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت- و ئەوانەدا کەوابوو جۆری ئەم قیاسە پێی دەوترێت قیاسێکی پوچەڵ، قیاسێکی دروست نیە، وتەکانی زانایان چییە لە چەسپاندنی قیاسی پوچەڵ؟ یەکەم: ڕێسای ئوسوڵی.. ئەگەر هاتوو جیاوازی هەبێت لە نێوان قیاسکراو و قیاس لەسەرکراوەکە ئەوا ئەمە پێی دەوترێت قیاسێك لەگەڵ جیاوازی، وە ڕێسایە ئوسوڵییەکە ئەوەیە کە قیاس لەگەڵ هەبوونی جیاوازی؛ باتڵە، ئەمە ڕێسایەکی جێگیرە لە لای زانایان کە قیاس کردن لەگەڵ بوونی جیاوازی باتڵە، بۆیە بە حوکمێك هەژمار ناکرێت ئەگەر جیاوازییێك هەبوو لە نێوان قیاسکراو و قیاس لەسەرکراو؛ ئەمە وتەی ئوسوڵییەکانە لە لای ئەهلی سوننە و جەماعە کە قیاس کردن لەگەڵ بوونی جیاوازی قیاسێکی باتڵە، بە هەمان شێوە پێی دەوترێت "قیاسی فاسد"، ئیبن قەییم -رحمە الله- دەڵێت: "هەرچی ئەوەی تێکچووە لە کاروباری جیهان و لێی خراپ و وێران بووە ئەوا هەر

بەهۆی قیاسی پوچەڵەوەیە -فاسد-" ئەمە وتەی ئیبن قەییم -رحمه الله- لە (إعلام الموقّعين)، وە ئیمامی شاتبی لە (الإعتصام) دەڵێت: "قیاسی پوچەڵ ناکرێت دابنرێت لە دیندا" واتە ناکرێت قیاسێکی پوچەڵ بێنین پاشانیش بڵێین ئەمە لە دیندایە و پێویستە کاری پێبکەین، "قیاسی پوچەڵ بریتییە لەوەی دانانرێت لە دیندا چونکە دەبێتە هۆی سەرپێچیکردنی شەرع، وە بەهۆی ئەم قیاسەوە حەڵاڵ لە شەرعدا دەبێتە حەرام و حەرامیش دەبێتە حەڵاڵ" ئەمە وتەی ئیمامی شاتبی بوو -رحمه الله- لە (الإعتصام) کە قیاسی پوچەڵ لە بنەڕەتدا لە دین هەژمار ناکرێت و هەروەها دەبێتە هۆی حەڵاڵکردنی حەرام و حەرامکردنی حەڵاڵ، وە ئەمە بنچینەی هەموو خراپەیەکە هەروەك ئیبن قەییم -رحمه الله- وتی لە (إعلام الموقّعين)، سەبارەت بە ئیمامی أحمد -رحمه الله- ئەوا ئیبن قەییم لە (إعلام الموقّعين) لەوی گواستوەتەوە کە دەڵێت قیاس بریتییە لەوەی قیاسکراو لێکچوو بێت لەگەڵ قیاس لەسەرکراوەکە لە هەموو بارێکدا، ئێستا وتەکەی دەگوازمەوە بە مانا نەك بە دەق؛ بەوەی قیاسکراو لێکچوو بێت لەگەڵ قیاس لەسەرکراو لە هەموو بارێکدا ئینجا دەڵێت: "بەڵام ئەگەر لەو بچێت لە بارێکدا و پێچەوانەی بێت لە بارێکی تر ئینجا بتەوێت قیاسی بکەیت ئەوا هەڵەیە (ئەمە دەقی وتەی ئیمامی أحمد) بەڵام ئەگەر لەو بچێت لە بارێکدا و پێچەوانەی بێت لە بارێکی تر ئینجا بتەوێت قیاسی بکەیت ئەوا هەڵەیە، بەڵام ئەگەر لەو بچێت لە هەموو بارەکاندا کەچی جێبەجێت نەکرد و پشتت لێی هەڵکرد ئەوا لە دەروونمدا شتێك نادۆزمەوە لەمەدا"، ئەمە وتەی ئیمامی أحمد -رحمه الله-، ئیبن قەییم لێدوان دەدات لەسەر وتەی ئیمامی أحمد و دەڵێت: "وە ئەمە وتەی زۆرینەی حەنەفییەکان و حەنبەلییەکان و مالیکییەکانە" کەوایە هەموو دەڵێن پێویستە جیاوازی نەبێت لە نێوان قیاسکراو و قیاس لەسەرکراو، بەڵام ئەگەر ڕوویدا ئەوە دەڵێت ئەمە دروست نیە و بنچینەی هەموو خراپەیەکیش لەم شوێنەوە دەست پێدەکات، وە هەروەك دەبینیت خراپە لەوانەدا بە کوێ گەیشتووە کاتێك ئەم قیاسە پوچەڵەیان هێنا و حوکمێکیان بنیاتنا لەسەر ئەم قیاسە پوچەڵە، کە چۆن خۆیان خستە ناویەوە و چۆن ئوممەتیان ڕاکێشا بەدوای خۆیاندا بۆ ئەوەی ببن بە بەشێك لەم حکومەتە تاغوتییانە یان بەلایەنی کەمەوە ببنە هاوسۆزی ئەم حکومەتانە و ڕازی نەبن بە هیچ جێگرەوەیەك بۆیان تەنانەت ئەگەر جێگرەوەکە کەسانێك بن بیانەوێت حوکم بکەن بەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە، بۆیە ئەم بەڵگەهێنانەوەیە بەڵگەهێنانەوەیەکی پوچەڵە، ئێستاش دێینە سەر بەشی دووەم لە بابەتەکە؛ ئەوانە بەبێ شەرمانە دەڵێن پێغەمبەر یوسف بەشداری کردووە لە حوکم لەگەڵ پاشا، ئەم قسەیەیان پێچەوانەی چەند ئایەتە لە پەڕتوکی الله عز وجل؟ کاتێك دەڵێن پێغەمبەر یوسف بەشداری کردووە لەگەڵ پاشا لە حوکمدا بۆیە ئێمەش بەشداری دەکەین هەروەك چۆن پێغەمبەر یوسف (عليه السلام) بەشداری کردووە، ئەم قسەیەیان پێچەوانەی ژمارەیەك ئایەتە لە پەڕتوکی الله عز وجل، ئایەتی

یەکەم -سەرنج بدە-: پێغەمبەر یوسف کاتێك لە زیندان بوو -درودی الله لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت- زیندانییەکانی فێری بیروباوەڕ و بابەتەکانی دین دەکرد ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٣٩ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٠﴾[1] ، واتە: ئەی هاوەڵانی زیندانم، ئایا چەند خوایەکی هەمەجۆر و جیاوازی (بپەرسترێن) چاکترن، یاخود خوایەکی تاك و تەنها و زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا؟ * جا هەرچی ئێوە دەیپەرستن جگە لە الله، تەنها خۆتان و باو وباپیرانتان ناوتان لێناون، هەرگیز الله تعالی بەوە ڕازی نیە و هیچ بەڵگەیەکیشی ڕەوانە نەکردووە لەسەر پەسەند کردنیان، بەڕاستی حوکم و فەرمانڕەوایی بۆ جگە لە الله شایستەی کەسی تر نیە، فەرمانیشی داوە جگە لە خۆی کەسی تر نەپەرستن، هەر ئەوەش دین و بەرنامەی پەسەند و ڕاست و دروست و بەرزە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستییانە نازانن و لێی بێئاگان. ئەم قسانە یوسف (عليه السلام) فەرمووی لە تاریکاییەکانی زیندان لە کاتێکدا چەوساوە بوو، لە ناو زینداندا چەسپاندی کە حوکم هەر بۆ الله ـیە -عز وجل-، وە ئەو قسەیەی پێغەمبەر یوسف کردی الله تعالی لێی ڕازی بوو ئینجا بە وەحی دایبەزاند لە کۆتا پەیامی بۆ ئینسانەکان تاکو هەڵسانی قیامەت، ئەمە وتەی پێغەمبەر یوسف بوو لە زینداندا جا ئایا دوای ئەمە دەکرێت لە زیندان دەربچێت و بڵێت حوکم بۆ تاغوتە؟! چۆن دەیگونجێنی؟ بۆیە ئێستا ئەم قسەیە کاتێك دەڵێیت ئەو بەشداری کرد لەگەڵ پاشا لە حوکمدا ئەوا ئەم قسەیەت پێچەوانەی ئەوە دەبێت کە پێغەمبەر یوسف فەرمووی و الله تعالی بە ڕێگەی وەحی بۆی دابەزاندووین لە قورئان (إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ) ئەمە وتەی پێغەمبەر یوسف ـە، جا کەسێك ئەمە قسەی بێت دوای ئەوە ناکرێت ئەگەر لە زیندان چووە دەرەوە و ئەم پاشایەش ئەگەر تاغوت بێت ئەوا بەشداری لەگەڵ بکات لە حوکمدا و حوکم بکاتە هی جگە لە الله و بیکاتە هی تاغوت، مەحاڵە ئەم کارە، بۆچی؟ چونکە دژبوون و پێچەوانەبوونی قسە لەگەڵ کردار الله عز وجل لێی ڕازی نابێت لە تاکەکانی مسوڵمانان، شتێك بڵێیت پاشان کار بکەی بە پێچەوانەی ئەوەی دەیڵێیت ئەمە الله عز وجل پێی ڕازی نابێت لە تاکەکانی ئیمانداران، بەڵگەی ئەمە الله تعالی دەفەرموێت قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٣﴾[2] ، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی شتێك دەڵێن و ئەنجامی نادەن؟ بۆچی گوفتارتان دژی کردارتانە؟ * خەشم و ڕقێکی گەورەیە لای الله ئەوەی کە دەیڵێن و نایکەن. منی ئیماندار ئەگەر قسەیەکم کرد

---

(١) یوسف: ٣٩ – ٤٠ .

(٢) الصف: ٢ – ٣.

پاشانیش کردەوەکەم پێچەوانە و دژی بوو ئەوا من لە پێگەیەکم کە خەشم و ڕقی الله ـی -عز وجل- لەسەرە، ئەی چی بگات بە پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی الله عز وجل بڵێت "إن الحکم إلا لله" کەچی دواتریش حوکمەکە بکاتە هی تاغوتێك لە تاغوتەکان؟! ناکرێت ئەمە ڕووبدات، ئینجا ئەگەر تاکەکانی ئیمانداران لە پێگەیەکی ڕق و خەشمی -الله تعالی- بن ئەی چی دەڵێیت بۆ خاوەنانی پلە بەرزەکان، ئەوانەش بە هەمان شێوە الله عز وجل ڕق و خەشمی لێیانە یان ئەوانە بارودۆخیان زۆر قوڕسترە لە بارودۆخی من؟ ئەو کەسەی خاوەنی پلەیەکی بەرزە پاشانیش سەرپێچی بکات ئەوا سزاکەی توند و قوڕسترە لە سزای تاکەکانی ئیمانداران کاتێك سەرپێچی بکەن، سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزە بدە لە سوڕەتی (الأحزاب) :﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ۝٣٠﴾[1]واتە:ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر: هەرکەس لەئێوە بە گوناهێکی گەورەی ئاشکرا هەستێت، ئەوە بابزانێت کە دووبەرابەر سزا دەدرێت، ئەوەش لەلای الله زۆر ئاسانە چونکە ئێوە قەدرو ڕێزی تایبەتیتان هەیە. ، بۆچی؟ مەگەر ئافرەتێك نیە لە ئافرەتانی مسوڵمان؟ ئەی بۆچی سزاکەی دەبێتە دوو بەرامبەر کاتێك سەرپێچییێك ئەنجام دەدات کە لەوانەیە بە دەیان ئافرەت نموونەی ئەم سەرپێچییە ئەنجام بدەن؟ لەبەرئەوەی پلە وپایەکەی بەرزترە لە ئافرەتانی تر، ئەو هاوسەری پێغەمبەرێکە و دایکێکی ئیماندارانە ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡۗ﴾[2] ، کەوایە پلە وپایەکەی بەرزترە لە ئافرەتانی تر بەوەی خێزانی پێغەمبەرێکە و هەروەها دایکێکی ئیماندارانە بۆیە کاتێك سەرپێچی بکات سزاکەی سەختتر دەبێت لە سزای ئافرەتی مسوڵمان کە لەم پلەیەدا نیە، هەروەها الله تعالی بە پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت ﴿وَلَوۡلَآ أَن ثَبَّتۡنَٰكَ لَقَدۡ كِدتَّ تَرۡكَنُ إِلَيۡهِمۡ شَيۡـٔٗا قَلِيلًا ۝٧٤ إِذٗا لَّأَذَقۡنَٰكَ ضِعۡفَ ٱلۡحَيَوٰةِ وَضِعۡفَ ٱلۡمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيۡنَا نَصِيرٗا ۝٧٥﴾[3] ، واتە: خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان پایەدار و دامەزراو نەکردایە، ئەوە بەڕاستی نزیك بوویت (بە مەزەندەی خۆت، بۆ بەرژەوەندیی بانگەوازەکەت) کەمێك بە لایاندا مەیل بکەیت و بەدڵی ئەوان بکەیت! * ئەو کاتە ئیتر دوو بەرامبەری (هاوەڵگەران) لە دونیادا و بە دوو بەرامبەری ئەوان لە دوای مردن سزا و ئازارمان پێ دەچەشتیت، پاشان کەسیشت دەست نەدەکەوت فریات بکەوێت و لە دەستی ئێمە ڕزگارت بکات. تەنها بەوەی مەیلت هەبێت بۆ ئەوانە، لەوانەیە ئیماندارێك مەیل بکات ئەوا سەرپێچیکارە و گوناهبارە بەڵام خوانەخواستە پێغەمبەر ئەگەر مەیل بکات ئەوا فەرمووی سزاکە دەبێتە چەند هێندە، لە دونیادا سزا دەدرێت و چەند هێندەی ئەو

(١) الأحزاب: ٣٠.

(٢) الأحزاب: ٦.

(٣) الإسراء: ٧٤ – ٧٥.

سزایەی لە دونیا دەبێت ئەوا بەهۆیەوە لە دوارۆژدا سزا دەدرێت کە هەر ئەمەیە ئیمامی (الشنقیطي - رحمه الله-) باسی کردووە، وە پێم وابێت بە هەمان شێوە لە (الزرکشي) گواستویەتیەوە، جا کاتێك پلە وپایەکە بەرز بوو ناکرێت دژیەکبوون و پێچەوانەیی هەبێت لە نێوان وتە و کرداردا، وە پێغەمبەر یوسف پلە وپایەکەی لە چوارچێوەی پلەی پێغەمبەرانە، جا ئەوەی الله پێی ڕازی نیە لە تاکەکانی ئیمانداران ئەوا ناکرێت قبوڵی بکات لە پێغەمبەر یوسف کە لە زیندان وتی: " إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ" پاشان دەربچێت و بە پاشا بڵێت حوکم بۆ تۆیە، ئەم قسەیە یەکناگرێتەوە لەگەڵ ئەم ئایەتە پیرۆزە، کەوابوو ئەم قسەیە تێکگیر دەبێت لەگەڵ ئەم ئایەتە، ئایەتی دووەم: الله تعالى دەفەرموێت ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٣٦﴾[1] واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێیان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها الله بپەرستن، خۆتان دووره پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر، جا هەبوو لەو خەڵکە (کە بیرو هۆش و ژیری خۆی خستەکارو بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕا) خوایش هیدایەتی دەدا، هەشیان بوو خۆی شایستەی گومڕایی دەکردو بەسەریدا دەچەسپا، کەوابوو بگەڕێن بەسەر زەویداو سەرنج بدەن، بزانن چۆن بوو سەرەنجامی ئەو کەسانەی بڕوایان بە بەرنامەی ئێمە نەبوو.، پەیامی هەموو پێغەمبەران بەبێ جیاکردنەوە هەمووی لەسەر دوو کۆڵەکە دامەزراوە؛ کۆڵەکەی یەکەم: خەڵك بانگ بکەن بۆ بەندایەتیکردنی الله عز وجل، کۆڵەکەی دووەم: بانگیان بکەن بۆ دوورکەوتنەوە لە تاغوت (وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ) کەوایە ئەمە خاڵی هاوبەشە لە بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانی الله عز وجل هەر لە سەردەمی ئادەم تاکو ناردنی پێغەمبەری ئێمە (ﷺ)، هەموویان کاریان کردووە لە چوارچێوەی ئەم دوو کۆڵەکەیە؛ بانگەوازکردنی خەڵك بۆ بەندایەتیکردنی الله، وە بانگەوازکردنی خەڵك بۆ دوورکەوتنەوە لە تاغوت، وە تۆ دەزانیت کە وشەی (اجتناب) ئەوەیە بوونت نەبێت لە شوێنێك کە تاغوتێکی لێیە، وە پێشتریش باسی ئەم ئایەتەمان کرد، جا قسەی ئەوانە کە دەڵێن پێغەمبەر یوسف بەشداری کردووە لەگەڵ ئەم تاغوتە لە حوکمدا ئەوا پێچەوانەی ئەم ئایەتانەیە، ئەمە فەرموودەی الله عز وجل و ئەم پێغەمبەرە، وە ئەمەش قسەی کەسانێك لە سوکترینی خەڵکی، الله عز وجل دەربارەی پێغەمبەران دەفەرموێت کە ئەوان هەر تەنها دوورناکەونەوە لە تاغوتان بەڵکو خەڵکیش بانگ دەکەن بۆ دوورکەوتنەوە لە تاغوتان، ئینجا ئەوەی خەڵك بانگ بکات بۆ دوورکەوتنەوە لە تاغوتان ئەوا

---

(١) النحل: ٣٦.

بەدڵنیاییەوە خۆی پابەند دەبێت بەم کارە، چونکە ناکرێت پێغەمبەرێك بە خەڵکی بڵێت دووربکەونەوە لە تاغوت کەچی دوای ئەمە ببێتە بەشێك لە پێکهاتەی حکومەتی تاغوت -پەنا بە الله لەوەی بابەتەکە بەم شێوەیە بێت- چونکە پێویستە لەسەریان یان بڵێن پێغەمبەر یوسف پێغەمبەر نەبووە، ئەو کاتە بۆی هەیە بچێتە هەر جێگەیەك و پێگەیەك کە بیەوێت یانیش دەبێت جێگیری بکەی کە ئەو پێغەمبەر بووە جا ئەگەر جێگیرت کرد ئەو پێغەمبەر بووە ئەوا پەیامەکەی دامەزراوە لەسەر ئەوەی دووربکەونەوە لە تاغوت نەك ببن بە بەشێك لە تاغوت، بۆیە ئەم قسەیەیان کە دەڵێن پێغەمبەر یوسف بەشداری کردووە لەگەڵ پاشا لە حوکمدا پێچەوانەی ئەم ئایەتانەیە، کە ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت پێغەمبەر یوسف دوور نەکەوتوەتەوە لە تاغوت بەم شێوەیەی الله عز وجل فەرمانی پێکردووە، وە خەڵکی بانگ نەکردووە بۆ دوورکەوتنەوە لە تاغوت لە کاتێکدا بەشێك یاخود نیوەی پەیامەکەیەتی! ، چۆن دەکرێت پێغەمبەر بێت و پاشانیش پێچەوانەی بانگەوازەکەی بکات، وە خەڵکی بانگ نەکات بۆ ئەو شتەی کە فەرمانی پێکراوە بانگەواز بکات بۆ لای؟! الله عز وجل فەرمانی پێکردووە بانگی خەڵك بکات بۆ ئەوەی دووربکەونەوە لە تاغوت کەواتە کوانێ ئەمە؟! ئەگەر وتمان بەشداری کردووە لەگەڵ تاغوت لە حوکمدا کەوایە کوانێ دوورکەوتنەوە؟! بۆیە ئەم قسەیە پێچەوانەی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە، ئایەتی سێیەم: الله عز وجل دەفەرموێت ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ ﴾[1] ، واتە: ئا بەم شێوەیە دەسەڵاتمان دا بە یوسف و جێگیر وپایەدارمان کرد لە خاکی میسڕدا، هەر پلە وپایەیەکی دەویست لەو وڵاتەدا دەستی دەکەوت بۆی ساز دەبوو. ئەوەی خوێندوومەتەوە لە وتەکانی زانایان -رحمهم الله- ئەوەیە کە دەڵێن "متمكن": واتە ئەو کەسەیە فەرمان و قەدەغەی هەیە لە زەویدا، وەك حاڵی دەسەڵاتداری و پایەداربوونی ئێستامان، هەر کەسێك الله عز وجل پایەدار و دەسەڵاتداری بکات ئەوا فەرمان دەکات و قەدەغە دەکات (وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ ) کەوایە جێنشینی و پایەداربوون جێگیر بوو بۆ پێغەمبەر یوسف بە وەحییەکی خوایی و بە ئایەتێکی قورئانی، هیچ کەسێك ناکۆك نیە لەسەر ئەمە کە پایەداربوون هاتەدی بۆ پێغەمبەر یوسف، ئینجا ئەگەر تەمکینی بۆ چەسپا کە ئەمەش جێگیرە، کەسێك الله عز وجل پایەداری بکات لە زەویدا، چی دەکات؟ سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزە بدە ﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ۝٤١ ﴾[2] واتە: ئەوانەی کە ئەگەر پایەدارمان کردن لە زەویدا نوێژ و دروشمەکانی بەچاکی ڕادەگرن، زەکاتیش بەتەواوی دەدەن، فەرمان بەچاکە دەکەن، قەدەغە لە خراپە دەکەن،

(١) يوسف: ٥٦.
(٢) الحج: ٤١.

سەرئەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆ لای خوا دەگەرێتەوە.، پێغەمبەر یوسف الله عز وجل پایەداری کرد لە زەویدا پاشان الله عز وجل حوکمێکی گشتی هێنایەوە بۆ هەموو کەسێك کە پایەدار و دەسەڵاتداری دەکات لە زەویدا، هەر کەسێك الله عز وجل پایەداری بکات لە زەویدا ئەوا ئەم چوار کارە دەکات؛ فەرمان دەکات بە خەڵکی بەوەی نوێژ بکەن و زەکاتیان لێوەردەگرێت و فەرمان دەکات بە چاکە و ڕێگری دەکات لە خراپە، کەوایە بەدڵنیاییەوە پێغەمبەر یوسف دەبێت فەرمان بکات بە چاکە و ڕێگری بکات لە خراپە، وە هیچ خراپەیەك لەوە گەورەتر نیە کە دەسەڵاتدارێك هەبێت حوکم بکات بە جگە لەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە، هیچ خراپەیەك نیە لەمە گەورەتر بێت، جا ئەگەر چەسپا ئەمە مونکەڕ و خراپەیە، وە داواکراوە لە پێغەمبەر یوسف ڕێگری بکات لەم خراپەیە، باشە، ئیتر چۆن دەبێتە بەشێك لە خراپەکە؟! واجب وایە ڕێگری بکات لە خراپە، ئەو کەسانە دەڵێن یوسف (عليه السلام) بووەتە بەشێك لەم خراپەیە! ئەم قسەیەش هەروەك دەبینی پێچەوانەی فەرموودەی الله ـیە -عز وجل- (أ **وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ** ) کەوابوو ئەم قسەیەیان پێچەوانە و دژی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە لە پەڕتوکی الله عز وجل، سەبارەت بە ئایەتی چوارەم ئەوا پێغەمبەر یوسف دەفەرموێت ﴿**إِنِّي تَرَكۡتُ مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ٣٧ وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ٣٨**﴾[(١)] واتە: (یوسف وتی: بەڕاستی من بەرنامەی قەومێکم واز لێهێناوە کە باوەڕ بە خوا ناهێنن و هەمیشە بڕوایان بە قیامەتیش نی یە* بەڵکو شوێنی ئایین و بەرنامەی باو و باپیرانم ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب کەوتووم، هەرگیز ڕەوا نی یە بۆ ئێمە هیچ جۆرە شتێك بکەینە هاوەڵ و شەریك بۆ خوا، ئەوەش لە فەزڵ و ڕێزی تایبەتی خوایی یە لەسەر ئێمە و لەسەر خەڵکیش، بەڵام بەداخەوە زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزاری ناکەن).، جا پێغەمبەر یوسف ئەم قسەیەی کرد فەرمووی من شوێنی دین و ڕێبازی ئیبراهیم کەوتووم، وە الله تعالی قسەی پێغەمبەر یوسف ـی بۆ گواستوینەتەوە لە ڕێگەی وەحی لە قورئان، ئەمە جێگیرە بە بڕاوەیی، باشە، کاتێك پێغەمبەر یوسف ڕاییگەیەنێت کە ئەو شوێنکەوتەی ئیبراهیم ـە (عليه السلام) ئەمە واتە ئەو هەڵدەستێت بەو کارانەی پێغەمبەر ئیبراهیم پێی هەڵساوە، وە ئەو کارانەی پێغەمبەر ئیبراهیم پێی هەڵساوە الله عز وجل باسی کردووە لەم ئایەتەدا ﴿**قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرۡنَا بِكُمۡ وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ**

---

(١) یوسف: ٣٧ – ٣٨.

﴿أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾[(١)] ، پێغەمبەر یوسف ڕایدەگەیەنێت، وە الله عز وجل پەسەندی دەکات و دەیگوازێتەوە کە ئەو شوێنی دین و ڕێبازی ئیبراهیم کەوتووە پاشان الله عز وجل بۆمان باس دەکات کە مانای شوێنکەوتنی (ملة إبراهيم) چییە؛ بەوەی ئەم کارانە بکەیت کە پێغەمبەر ئیبراهیم ئەنجامی داون بۆیە بەدڵنیاییەوە پێغەمبەر یوسف ئەو سیفەتانەی لەخۆیدا بەجێهێناوە کە پێغەمبەر ئیبراهیم هەیبووە، بەڵام ئەگەر بڵێت شوێنی دین و بەرنامەی ئیبراهیم کەوتووم پاشان لەگەڵ تاغوتان بێت، بەڕائەت نەکات لە خۆیان و خواکانیان و خۆی لێیان بەدوور نەگرێت! ئەمە یەکناگرێتەوە لەگەڵ فەرموودەی الله تعالى، ئەگینا هەر کەسێك بڵێت ئەو لەسەر دینی ئیبراهیم نیە ئەوا الله تعالى لەم بارەیەوە فەرموویەتی ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُ﴾[(٢)] ، واتە: ئایا کێ لە دینی ئیبراهیم پشت هەڵدەکات، جگە لەو کەسەی کە خۆی گێل و نەفام دەکات. وە پاکی و بێگەردی بۆ پێغەمبەر یوسف لەوەی خۆی گێل و نەفام بکات، حاشا بۆی لەم وەسفە، جا ئەو ڕایگەیاند کە من شوێنی دین و ڕێبازی ئیبراهیم کەوتووم، وە الله عز وجل باسی ئەوەی کردووە کە چی پێوستە لەسەرت ئەگەر شوێنی دین و ڕێبازی ئیبراهیم بکەویت، وە فەرمووی ئەگەر وازت هێنا لە دین و ڕێبازی ئیبراهیم ئەوا کەس وازی لێناهێنێت تەنها کەسێك نەبێت کە خۆی گێل و نەفام دەکات، پاکی بۆ پێغەمبەر یوسف لەوەی پێچەوانەی ئەوە بکات کە خۆی پێ پابەند و پەیوەست کرد پاشانیش دوای ئەمە وازی لێبێنێت بۆ ئەوەی ببێتە -پەرژین بێت لەو- یەکێك لەوانەی الله عز وجل لەبارەیانەوە دەفەرموێت (وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُ) کەوابوو ئەم قسەیەیان بەوەی گوایە پێغەمبەر یوسف بەشداری کردووە لەگەڵ پاشا لە حوکمدا پێچەوانەی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە، أقول قولي هذا واستغفروا الله لي ولكم وجزاكم الله خير الجزاء وبارك فيكم.

**وەرگێڕان و ئامادەکردنی**
**پێگەی ڕاستەڕێ**




(١) الممتحنة: ٤.
(٢) البقرة: ١٣٠.